# کیتابی ئیمـــان

# كِتَابُ الإِيمَانِ

راڤەکردنی
ماموٚستا کامەران کەریم رحمه الله

نووسین و ئامادە کردنی
شیخ موصعب

١٤٣٩ هـ

# پێشەکی :

بسم الله الرحمن الرحيم الحمدلله رب العالمين الصلاه والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه ومن والاه . سوپاسی الله تعالى دەکەین کەوا دیسانەوە یارمەتی داین بۆ ئەوەی دەست بکەین بە نوسینەوەی بابەتیکی گرینگ کە ماموٚستای خۆشەویستمان کامەران کەریم (رحمه الله) بۆمانی باسکردوە لە چەند وانەیەکدا و بۆی شی کردووینەتەوە کە بریتیە لە ئیمان . کەوا ئیمان چیە لە ئیسلامدا وە ئیمان چیە وە ئەهلی سونە و جەماعە چۆن پێناسەی ئیمانیان کردوە .

چونکە ئەبینین زۆربەی گروپە گومراکان پێناسەی ئیمانیان کردوە بەو جۆرەی خۆیان دەیانەوێت نەك بەو جۆرەی کە لەقورئاندا هاتووە وە هەیەلەو گروپانە زیادەی رەووی تێدا کردوە وەکو خواریجەکان وە هەشە کەمتەر خەمی تێدا کردوە وەکو مورجیئەکان جا بەپێ سەردەمەکان ئەم گروپانە هەولیان داوە بەلێدان لەئەهلی سونە و جەماعە وەکو ئەوەی بیانەوەی خۆیان لێیان نزیك بکەنەوە و بەجۆرەها فێل واخۆیان نیشان دەن کەوا بەراستی ئەوانیش لەموسلمانان بەلام بە پشتیوانی الله تعالى موسلمانان و زانایان هەردەم گومان و شوبهەکانیانی هەلوەشاندوونەتەوە لێرەدا ماموٚستا کامەرانی خۆشەویست (رحمه الله)لەشەرحی کشف الشبهات ی شێخ محمدی کوری عبدالوهاب(رحمه الله) و ئصولی سونەی ئیمامی أحمد و چەند کیتابێکیتردا کەتێدا باسی ئیماندەکا گومانەکانی بۆ ئێمە رۆشەن کردۆتەوە کەوا ئیمان چیە و چۆن ئەهلی سونە پێناسەیان کردوە وە حەقیقەتی ئیمانیش چیە ، وە وتەی گروپەکانیتر و تێگەیشتنی گروپەکانیتر چیە بۆ ئیمان ،

لەخوێندنەوەی ئەم کیتابە ان شاء الله زیاتر تێ دەگەین ئیمان چیە و کێ ئیماندارە و کێ ئیماندار نیە.

(وصل الله وسلم على نبينا محمد وآله وصحبه. )

## (وجوب تطبيق التوحيد بالقلب واللسان والجوارح إلا لعذر شرعي)

شێخ محمدی کوری عبدالوهاب دەڵێ : (الكلام إن شاء الله تعالى بمسألة عظيمة مهمة جدا تفهم مما تقدم ولكن نفرد لها الكلام لعظم شأنها ولكثرة الغلط فيها فنقول) ئەڵێ قسەمان بەوە دەست پێ دەکەین کەوا بابەتێکی زۆر گەورە وموهیم باس دەکەین لەوەی کە رابورد ئینسان تێ دەگا بەتەنها  باسی دەکەین چونکە بەراستی زۆر کەس تێدا کەوتۆتە هەڵەوە مەبەستی لە رابردوان و ئێستاشە چەندەها مزاهیب لەم بابەتە دروست بووە .

(لا خلاف أن التوحيد لابد أن يكون بالقلب واللسان والعمل) کە وتی لا خیلاف واتا إجماعە ،خیلاف نیە لەنێوان علماء یان واتا إجماعە لەسەر ئەمە کە تەوحید و ئیمان بریتیە : بەدل و بەزمان و بەکردەوە دێتە جێگا و دروست دەبێ ، واتا محلی ئیمان پێویستە لەدلدا بێ بەزمانیش بێ وە لەکارو کردەوەی چوار پەلەی ئینساندا بێ ئەم بابەتە کە بابەتی ئیمانە ئەهلی سونە و جماعە ئیمان و باوەریان بەم شێوەییە .

لەدلدا پێویستە قولی قەلب هەبێ کە بریتیە لە عیلم و تصديق وە ئیقرار ، وەدەبێ عەمەلی قەلب هەبێ کە بریتیە : لە حب و رجاء وخوف و إناب هەتا دوای باقی هەموو کارەکانی دل تەبعەن ئەعمالی دل زۆر زیاترێکە لە قەولی دل قەولی دل بریتیە لە تصديق و ئیقرار و عیلم ، بەلاَم کاری دل بریتیە لە حب بریتیە لە رجاء بریتیە لە خوف وە بریتین لە باقی ئەو کارانەی کە ئەگەر ئینسان نەیبێت ئەوە ئەو کەسە ئیماندار نیە  بۆ نمونە : خوات خۆش نەوێ ئیماندار نیت لە خوا نەترسیت ئیماندار نیت هیوات بەخوا نەبێ ئیماندار نیت هەروەها باقی تری کارەکانی دل .

وە دەفەرموویت (واللسان)ئیمان ئەبێ لەسەر زمان بێ کە ئەمە قەولی لیسانە کە بریتیە لە (لا اله الا الله ومحمد الرسول الله صل الله عليه وسلم) وە هەروەها

ئەوشتانەی کەوا بە زمان ئەوترێی لە زیکر و قورئان خوێندن و لەئەمر بە معروف و نەهی لە منکر کە بەزمان دەر ئەبرێت .
وە دەفەرمووی (والعمل ) مەبەستی پێ عەمەلی جەواریحە لەسەرووی هەموویانەوە نوێژ پاشان زەکات پاشان رۆژو و پاشان حەج وە هەر کارێك لەوکارانەی کە کردنیان چ رووکن بێ لە ئیماندا چ واجب بێت چ مستحب بێ .
وە تەرك کردنی ئەو کارانەی کە تەرك کردنیان رووکنە یاخود واجبە یاخود مستحبە پێویستە ئینسان ئاگاداری ئەم کارانە بێ .
ئەمانەی باسمان کرد ئیعتقادی ئەهلی سونە و جماعەیە .

ئیمامی احمد دەفەرمووی ( الایمان قول وعمل ، یزد و ینقص ،کما جاء في الخبر (أكمل المؤمنين ، إيمانا أحسنهم خلقا ) باسی ئیمانمان بۆ دەکا
ئیمام پێناسەی ئیمانی بۆ کردین بە رووکنەکانی پێناسەکە کە بریتیە لە (الایمان قول وعمل ، یزد و ینقص)وە دەلیلی هێنایەوە لەسەر زیاد بوونی کە حەدیثیکی هێنایەوە ، (أكمل المؤمنين)تەواو ترین یانی چ کە تەواو ترین بێ واتا تەواو هەیە تەواوتر هەیە تەواوترینیش هەیە ، کەواتە پێ ئەوە کەم و نوقصان هەیە بۆیە ئەم حەدیثەی کرد بە دەلیل لەسەر زیادە و نوقصان .
نەك لەسەر ئەوەی عەمەل مەرجی کەمالە زۆر کەس بەداخەوە ئەم حەدیثە ئەهێنێتەوە و ئەیکا بەدەلیل و ئەلێ عەمەل مەرجی کەمالە ئەلێن ئەوە نیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی ((أكمل المؤمنين ، إيمانا أحسنهم خلقا)ئەمە دەلیل نیە لەسەر ئەوەی کە عەمەل مەرجی کەمالە کە وا دەلێن ، نەخێر بەلکو ئەمە دەلیلە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیاد و کەم دەکا ، تۆ بلێ تەواوترینی ئەو کەسەی ئیمانی هەیە ئەوەی کە ئەخلاقی جوان بێ ،مانای وایە لەو کەمتر هەیە وە کەم کەم دەبێ هەتاوەکو نامێنی .

ئیمان ئەگەر زۆر بكا و كەم بكا بۆ نمونە :ئێستا دۆلكەیەك ئاو هەرتێ بكا هەر تێ بكە ئاو زیاد دەكا تا لێ دەرژێی بەلام كونێكی تیا بكە هەر لێ كەم دەبێتەوە لە كۆتایدا وای لێ دێت نامێنی .

ئەم وتەی ئیمامی ئەحمەد كە ئەم قسەی بۆ ئێمە كرد ئەمە كۆدەنگی زانایانی ئیسلامە كە ئیمان بریتیە لە قەول و عەمەل ، بەلام ئەبێ وردی بكەینەوە .

تەبعەن قەول: قەولی قەلبە وە قەولی زمانە ، وە عەمەل :عەمەلی قەلبە وە عەمەلی جواریحە . ئەبێ هەر چوار شتەكەمان هەبێ

تەقسیمێكی سێ یانە هەیە كە زانایان ئەلێن: (إعتقاد قول وعمل) بە تەقسیمێكی دووانی ئەلێن (قول وعمل)بەلام ئەیكەنەوە بە چواری قەول قەولی قەلب و زمان وە عەمەلیش عەمەلی قەلب و جواریح واتا ئەندامەكانی لاشە.

ئینجا (یزد وینقص)ئەگەر ئێمە ئاوا سەیر بكەین ئەبینین شەش شتە :

١-قەولی قەلب (دل).

٢-قولی زمان.

٣-عەمەلی قەلب (دل).

٤-عەمەلی جواریح(ئەندامەكانی لاشە).

٥-یزید(زیاد ئەكا).

٦-وینقص(كەم دەكا).

ئەگەر بلێن (إعتقاد قول وعمل یزد وینقص)ئەوە ئەبێتە پێنج ،بەلام ئەگەر بلێن (قول وعمل ،یزد وینقص)ئەوە بووە چوار . هەموو ئەمانەش تەواوە هیچ كێشەیەكمان نیە لەگەل ئەمانە .

شاریح دەلێ(قال المؤلیف الایمان قول وعمل وهو معتقد أهل السنة والجماعة أن الایمان له أركان)یەكسەر پێ وتین ئیمان ئەركانی هەیە ئەركان جەمعی رووكنە.

رووكن ئەوەیە لەداخیلی شتەكەدا بێ بەبێ ئەو رووكنە ئەو ئیشە جێ بەجێ نابێ وە ئەو كارە (لایصح)نەك (لا كتمل).

سەیرکەن ئەم خالە زۆر گرینگە تێگەیشتنی بابەتی وەرگرتنی پێناسەی ئیمان لەلای ئەهلی سونە و جەماعە کەلیماتەکان بەجوانی وەربگرین

ئەلێ (أن الایمان لە أرکان)ئیمان رووکنی هەیە (منها الأقوال)لەهەندێك وتە هەیە رووکنە بۆ ئیمان (منها إعتقادات ومنها الأعمال)ئەمە تەقسیمە سێ دانەکەی هێنا و لەهەرسێکیان هەیە رووکنە لەئیمان .

مەبەستی لە إعتقاد ئەوەیە کە پەیوەستە بەدلەوە ئەبێت بەدوو بەشەوە : قەول و عەمەلی قەلبی .کەواتە کەوتی إعتقاد دەبێتە قەول و عەمەلی قەلبی .

ئینجا کە ئەلێت (لأقوال)مەبەستی پێ قەولی زمانە (ویدل علی هذا أنصوص التي وصفة عدید من الأفعال والأعمال من الایمان)دەلیلمان بۆ ئەمە هەموو ئەو نصوصانەی لەقورئان وسونەدا هاتووە لە قەول و عەمەل وتویەتی لە إعتقادات وتویەتی ئیمانە .

بۆنمونە (مَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ)[1]مەبەستی پێ نوێژە کەواتە نوێژ بەئیمان ناوبرا . یاخود ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەهێنێتەوە : (لإیمان بضع وسبعون أو ستون شعبة ، أعلاها قول: لا إله إلا الله، وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان)[2]ئیمان شێست وئەوەندەیە یان حەفتا و ئەوەندە بەشە . ئەگەر سەرنج لەفەرموودەکە بدەین ئەلێ: (فجعل قول لا اله الا الله من الایمان)لا اله الا الله ی لەئیمان حیساب کرد (وجعل الاحیاء وهو من الاعمال القلوب وهو من الایمان)حەیاو شەرم کە لە کردەوەی دلە لە بیروباوەر و ئیعتقاداتە کردی بە ئیمان (فجعل إماطة الأذی عن الطریق من الأعمال من الایمان)کەواتە هەرسێ بەشەکەی کۆکردەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەئیمان . بەلام ئاگاداربن نەچی ئەمە بهێنی بۆ ئەوەی ئەهلی بیدع لە مورجیئە بەئاسانی رەدت بداتەوە بلێ والله (إماطة الأذی)ئەوەتا لێرە باس کراوە  ئەو پێت ئەلێ ئایا ئەگەر (إماطة الأذی)نەکەی کافر ئەبێ؟! تۆ ئەگەر بلێ ئا نەخیر وانیە چونکە بەمە کافر نابێ

[1] :سورة البقرة اية : ١٤٣
[2] :رواه مسلم.

،مەبەستەکەمان ئەوە نیە کەوا رووکنی ئیمان بێ مەبەستمان لێرە لەتەقسیمی ئیمانە بەسێ بەشەوە نەك ئەگەر (إماطة الأذى)نەکرد ئەوە کافر ئەبی کەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەقسیمی ئیمانی کردوە بەسێ بەشەوە کە ئیعتقادی قەول و عەمەل ، بەلاْم ئێمە ئەگەر سەیری ئەهلی سونە بکەین هەریەکێك لە ئیعتقاد و قەول و عەمەل ئەرکانمان بۆ دەر دەهێنن ، واتا هەریەکێك لەم سێ بەشە خۆی لەخۆیدا رووکنە بەس ئاگاداربن بۆ ئەوەی لە معتەزیلە و خواریج جیابین ، نالێن ئەعمالی جواریح هەمووی رووکن بێ ئەگەر یەکێك لەوکارانەت نەکرد کافر ئەبێ نا وانالێن وەك یەك لەواجبات و محرامات نەکرد کافر دەبی ئەهلی سونە وانالێت

(وقد قال الله تعالى : **وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ**)[٣]مەبەستی پێی وتویان ئەو کەسانەی کە نوێژیان کردوە رووبەرووی بيت المقديس ئێستاش ئێمە رووومان کردۆتە کەعبە ئایا نوێژەکانیان چی بەسەر دێی خوای گەورە فەرمووی نوێژی ئەمانە بزر ناکا ناوی نا بەئیمان خوای تبارك وتعالى .(التى صلاتهما الى بيت المقديس قبل تحويل القبل )پێش ئەوەی کەوا رووگە بگۆرێت لە بيت المقديسەوە بۆ کەعبە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وصەحابەکان روویان ئەکردە ئەوێی دواتر کە ئایەتەکە هاتە خوارەوە لەسەر داخوازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە خوای گەورە پێ فەرموو رووبکەرە کەعبە ،ئەوانەی پێشوو کە رووبانکردۆتە بيت المقديس وتیان : ئەوان چیان لێ بەسەر دێی (فسم صلاتهم وهى من الاعمال الايمان ونوص فيها كثيرة)ئایەتەکە ئەم نوێژەی بەئیمان ناوبرد .

(إذا تقرر هذا فإن الأقول ركن في الايمان والأعمال ركن في الايمان وإعتقادات ركن في الايمان)ئەمەمان زانی ئەبێت ئەوەش بزانین کەوا هەریەك لەم سێ بەشە هەریەکەیان رووکنە لەئیمان بەلاْم رووکنیەتی ئەمانە ئەبێت ووریا بین سەرجەمی هەموو کردەوەکان هەمووی رووکن نیە باش ئاگاداری ئەمەبن .

---

[٣]:سورة البقرة اية :١٤٣

بۆیه زۆر له زانایان باسی ئەمەیان کردوه وەکو إبن تیمیه (رحمه الله)ئەلی جنسی عەمەل رووکنه .

جا بەداخەوە هەندێکیان عەساسەتیان بەم کەلیمەی جنسی عەمەل هەیه ئەلێن ئەمه قسەی خواریجه نازانی ئەمه إبن تیمیه له مجموع الفتاوی له کیتابی ئیماندا باسی کردوه وە زۆر لەعلماء یانی ئەمرۆش باسیان کردوه .

جنسی عەمەل :

هەموو عەمەل و کردەوە ناکەین بەرووکن بەلکو دەبیٚ تۆ عەمەلێك بکەی که ئیسپات و تەصدیقی ئەو ئیمانەبکەیت که هەته ،ئەگەر تۆ ئەو عەمەله ئەنجام نەدەی تۆ برواداار نیت .

ئینجا ئەو کردەوەیه ئایا نوێژە یاخود نوێژ نیه که خیلاف هەبیٚ کەکافره یاخود کافر نیه ئەوە نوێژ نەکا که قەولی راجح و راست ئەوەیه که کافره ئەمه ئەوە سەرمان لیٚ نەشێوێنی ئەوەی نەیوتوه کافره عەمەلی نەکردوه به بەرووکن لەئیماندا ، نەخێر ئەهلی سونه و جەماعه هەمووی قەولیان ئەوەیه إلا ئەبیٚ عەمەلت هەبیٚ عەمەلێکی واجب یاخود تەرکی موحەرەمێك یانی من زیناm تەکرد کرد لەبەر خاتری خوای گەروە یاخود عەرەق یاخود نوێژ دەکەم لەپێناوی خوای گەورە یان رۆژوو دەگرم یان حەج دەکەن ئەوە عەمەلەکەم هێنا و تەصدیقی ئیمانەکەم پیٚ کرد .

ئینجا باسی ئەوە دەکەن کەوا ئەوەی واز لەنوێژ بهێنی و نوێژ نەکا ئەلێن ئەوەتا زۆرێك لەزانایانی متأخرین ئەلێن ئەوەی نوێژ نەکا کافر نیه مادەم ئیمانی پیٚ هەبیٚ کەواته مادەم کافر نەبیٚ بەهیچ عەمەلێك کافر نابیٚ ! ئەمه هەلەیه ئەم قسەیه ئەمان ئەوەیان نەوتوه وتویانه (لابد من عمل)عەمەل نەبێت تۆ درۆ ئەکەیت چونکه تەصدیقی ئیمانەکەت نەکرد ،ئێستا پێغەمبەر ئیبراهیم کاتێك که خەوەکەی بینی خوای گەورە پیٚ فەرموو :إسماعیل سەر ببرە بروای پێکرد بەس ئەم تەصدیقه کافی بوو !؟ هەتاوەکو چەقۆکەی نەخسته سەری ملی ئینجا خوای گەروە پیٚ فەرموو مەکه ئینجا پیٚ فەرموو(قَدْ صَدَّقْتَ

الرُّؤْيَا)[٤]تۆنەصدیقی خەوەکەت کرد بەم کردەوەیە کەواتە دەبێت تۆ کردەوەکە ئەنجام بدەی ئینجا ئەوە تەصدیقی ئیمانەکەیە بەومانایەی تەصدیق هەر بریتی نیە لە ئیقراری دل باش ئاگاداربن ئێستا یەهود و شەیطانیش تەصدیقی دل دەکا بە خوا وبەپێغەمبەر هەتاوەکو إبن تیمیە ئەلی: و شەیطان مصدیقە بەدلەکەی بەلام بەنەکردنی ئەو ئەمرەی کە پێکرا کافر بوو چونکە ججودی خوای نەکرد و شەیطان،.

بەداخەوە مورجیئەی ئەم زەمانەی ئێمە کە ئیدعای سەلەفیەت ئەکەن وە ئیدعای ئەهلی سونە و جەماعە دەکەن ئەلێن عەمەل جوزە لەئیمان نالێن روکنە ! ئاخر جوزئیەتی رووکنە یان واجبەتە یان موستحباتە بۆمان دیاری بکە کامەیە ؟! ئی عەمەل هەیە رووکنە هەیە واجبە هەیە موستحەباتە .ئێستا تۆ لێ بپرسە عەمەل چیە رووکنە یان جوزئیاتە چیە لەئیمان ؟ ئەلێن : جوزئیاتە لەئیمان و تەواو !یانی بەلای ئەوەوە جوزئێکە لە یان واجب یان موستحەب یانی بەتەرك کردنی ئەو کافری ناکا واتا هەرکەسێك تەرکی عەمەل بکا کافری ناکەن.بەلام لای هەموو زانایانی ئەهلی سونە وجماعە هەرکەسێك تەرکی عەمەل بە گشتی بکا کافرە (لا الایمان إلا بالعمل وعمل إلا بالایمان)[٥] نە ئیمان بەبێ عەمەل وەردەگیریی نەعەمەلیش بەبێ ئیمان وەردەگیری ،یانی لەئیعتقاددا ئەگەر تۆ ئەو بیروباوەرت نەبێ کە بیروباوەر لە قەول و دلە ئەوە تۆ ئیمانت لێ وەرناگیری ئەگەرلەزمانتان ئیقرار نەکەی ئیمانت لێ وەرناگیری ئەگەر بەعەمەل تەصدیقی نەکەی ئەگەر عەمەلەکە ئەدای واجێك بێ یان تەرکی موحرەمێك بێ ئەمە کۆدەنگی زانایانی هەمووی لەسەرە لەئەهلی سونە و جەماعە إلا مورجیئە نەبێ .

مورجیئە ئەلێت ئیمان قەول و عەمەلە بەس ئەگەر هیچ عەمەلیشی نەبێ رزگاری دەبێ ،ئێوە ئەوە تۆ مناقەضەی خۆتت کرد وەکو ئەوە وایە بلێ ئینسان

---

[٤] سورة الصافات اية :١٠٥
[٥] :شرح إعتقاد أعل السنة للالاكائي (٤١٩٣٠)

رۆح و جەسەدە بەس ئەگەر رۆحیشی نەبێ هەر ئینسان ئەژی ئاخر چۆن شتی وا دەبێ چونکە تۆ پێناسەی ئیمان بە دوو رووکن ئەکەی ئەلێت :ئینسان رۆح و جەسەدە رۆح بەبێ جەسەد نابێ وە جەسەدەیش بەبێ رۆح نەبێ هەر ئینسانە و دێت و دەروا ئاخر چۆن دەبێ ئەو تەعریفە هەلەیە چونکە خۆت مناقەضەی خۆتت کرد چونکە دەبێ قەول و عەمەل لەکەسەکەدا هەبێ ئەگەر قەول و عەمەل لەو کەسەدا نەبێ ئەو کەسە کافرە بۆیە تەرکی عەمەل بەکولی لەلای علمیان ئەوە ئەوکەسە کافرە .

بەئیتفاقی صەحابە ئەو کەسەی نوێژ تەرك بكا كافرە ئیمامی ئیسحاقی راهویە وە ئیمامی محمدی کوری نەصری مروەزیی لەکیتابی (تعظیم قدر الصلاة)ئیجماعمان بۆ نەقل دەکا ئایات و ئەحادیث ئیجماعی صەحابە تاریکی نوێژ مخلەدە واتا بەهەتا هەتاییەلە ئاگری جەهەنەم ئەلێ دەر ئەکرێی لەمیلەتی ئیسلام یانی کافرە ئەلێ ئەمە هیچ خیلافێك لەنێوان صەحابە نەبوو لەسەر ئەمە ، هەتاوەکو دواتر فقها هاتن ئەم خیلافەیان دروست کرد ئەگەر نا ئەگەر ئێمە بگەرێنەوە بۆلای صەحابە کەسیان نیە بلێن تاریکی نوێژ کافر نیە.وە ئەمە قەولی صەحابەیە وە قەولی زۆربەی زۆری تابعینیشە إلا لە سیغاری تابعین ئیمامی زوهری نەبێ وە لەدوای ئەو فقها ئەم ئیختلافەیان دروست کردوە . بۆیە ئەلێن ئەو قەولەی کە دەلێ تاریکی نوێژکافر نیە قەولێکی مرجوحە و راجح نیە بەلکو قەولی راجح ئەوەیە کە تاریکی نوێژ کافرە .

ئەم خیلافەش معوذورن بۆیە ئەلێن قەولەکە مرجوحە راجح نیە بۆیە لەنێو ئەهلی سونە دەرناکرێنە دەرەوە ئیمامی ئیسحاقی راهویەی[٦] ئەلێ :ئەلێ ئەو کەسەی تاریکی نوێژ کافرنەکا (موافق المرجیئە) .

---

[٦] : هاورێی ئیمامی ئەحمەدە ئەم ئیسحاقە وە سێ سالیش تەمەنی لە ئیمامی ئەحمەد گەورەترە یەکێکە لە ئیمامە گەورەکانی ئەهلی سونە و جماعە

جا هەیە لە فیرقە گومراکان وەکو مرجیئە بەهەموو جۆرەکانیانەوە : لە ئەشاعیرە و ماتوریدی و لەجەهمیەکان لەوانە ئەلێن کە ئینسان ئەلێت : ئینسان بەس بزانیت خوا هەیە ئەوە ئیماندارە ئەو کەسە ! ئەگەر نەزانێت خوا هەیە ئەوە تۆ کافریت واتا (معرفة الله إمانه والجهل بالله كفر )ئەمەش هەلەیە زۆر لەبەر ئەوەی خوای تعالی هەرئەمەندەی داوا نەکردوە ئێمە هەمووومان ئەزانین شەیطان بەگوێرەی ئەم پێناسەیە ئەبێ بە ئیماندار چونکە شەیطان لەهەموو کەسێك باشتر ئیمانی بە خوای تعالی هەیە شەیطان بەخۆی قسەی لەگەل خوای تعالی کردوە وە لەبەهەشت دەرکراوە وە هەموو پێغەمبەرانی بینیوە ئیمانیشی بە بابەتەکان هەمووی هەیە هەتا شێخ الاسلام ئەفەرمووی : مصدق لە قەلبی خۆیدا بەلام نواقضی ئەم ئیمانەی هێناوە ، کەواتە تەنها بەس نیە بلێن (معرفة الله) .

هەیانە لەم فیرقە گومرایانە ئەلی : ئەم کەسە ئەگەر قەولی قەلبی هەبێ ئەگەر عەمەلی قەلبیشی نەبێ هەر ئەبێت و ئیماندارە ! ئەمەش گومرایەکیترە .

وەهەیانە ئەلێ :ئەگەر ئەعمالی قەلبی هەبێ لەگەل قەولی قەلبی کافیە و ئیماندارە باسی قەولی لیسان ناکا یاخود ئەگەر باسی لیسانیش بکا باسی عەمەلی جواریح ناکا ئەمەش گومرایەکیترە .

واتا ئەم فیرقە گومرایانە ئەوانەی کەوا مرجیئەن و لەجۆرەکانی مرجیئەن نەوهاتن ئەم سێ خالە لەئیماندا کۆبکەنەوە .

بەرامبەریان لە فیرقە گومرایانە کە بریتین لە : موعتەزیلە وخەواریج ئەوان تەعریفەکەیان وەك ئەهلی سونەیە بەقەلب و لیسان و بەعەمەل بەلام ئەوان زێدە رەوویان کردوە لە مەسئەلەی عەمەلدا دێن هەموو عەمەلێك هەموو تاکێك لەتاکەکانی عەمەل ئەگەر چی رووکنیش نەبێ واتا واجب یان مستحب بێ هەر بەرووکنی دائەنین واتا بەنەبوونی هەر عەمەلێك تۆ کافر دەکەن یاخود بە کردنی تەرکی عەمەلێك کەتۆ لەسەرتە تەرکی بکەی وەکو زینا و قتل بەکردنی یەکێك لەوانە تۆ کافر دەکەن ئەوەش گومرایی ئەوانە .

ئەوەی گرینگترە باسی بکەین ئەوەیە لەئێستادا بەناوی سەلەفیەت و بەناوی ئەهلی سونە و جماعەوە بەداخەوە لەو عقیدەیە بلاوە لەسەرانسەری ولاتدا عقیدەی إرجاء ی کە لەعقیدەی خواریجی زیاتر بلاوە لەلای خەلکی یانی ئەوەی ئەمرۆ ئێمە سەرنجی ئەدەین خەلکی بەزۆری لە عقیدەی خواریج ئەترسێ وە ئەبێ بزانین کەوا عقیدەی خواریج عقیدەیەکی گومراییە  عقیدەیەکە کەوا پێچەوانەی ئەهلی سونە وجماعەیە بەلام ئەگەر سەرنج بدەین عقیدەی إرجاء گەلێك عقیدەیەکی منتشر و بەربلاوترێکە لەعقیدەی خواریج هەرواش بووە لەکۆن و نوێدا هەروابووە .

ئەوەتا سەیربکەن ئەمرۆ ئەوەی کە خۆی بە ئەهلی سونە و جماعە ئەزانی ئەوانەی کەوا بەناوی سەلەفیەتەوە بەناوی ئەهلی سونە وجماعەوە قسە ئەکەن ئەبنین کەوا پێناسەکەیان ئەوەیە کەوا :ئیمان قول وعەمەلە بەلام ئەگەر عەمەلەکەش نەبێ ئیمانەکە بەرێی ئەکەن بەبێ عەمەلی جواریح مەبەستیانە کەوا ئیمان دروستە ئەگەر چی هیچ عەمەلێکیشی نەبێ ! ئەوان ئەلێن عەمەل لە ئیمانە نالێن لە ئیماندا نیە بەس کێشەکەیان ئەوەیە لەواجبات و مستحبات دای ئەنێن واتا لە ئەرکان دای نانێن . وەدەبێ ئاگاداربین کەوا لە عەمەل هەمانە کە بە إجماعی صەحابە کە نوێژە ئەوە رووکنە بۆ ئیمان وەرووکنی عەمەلیە بۆ ئیمان ئەگەر ئەو نوێژە نەبێ ئەوکەسە کافرە بە إجماعی ئەهلی سونە و جماعە لە صەحابە وە لەتابعینیش بەلام لەدوای ئەمانەوە خیلاف دروست بووە کەکاتێك ئەمرۆ سەرنج ئەدەین ئەلێن جمهور ئەلێن ئەوەی نوێژ تەرك بکا کافر نیە بەبێ ئەوەی بزانێ جمهور واتای چی

جمهور : بزانین صەحابەی تێدایە !؟ بزانین تابعی تێدایە ؟! لە صیغاری تابعین ئەلێن ئیمامی زوهری وتویەتی : ئەگەر ئیمانی پێ هەبوو تەرکی کرد کافر نیە ،ئەما برۆ بۆ جمهەرەی تابعین چ جای إتفاقی هەموو صەحابە لەسەر ئەوەیە

کەوا تاریکی نوێژ کافرە ئینجا ئەگەر جمهورێك صەحابەی تێدا نەبێت کەی جمهورە .
یاخود ئەگەر خیلافێك لەدوای صەحابە دروست بێ ئێمە چۆن ئیعتباری بۆ ئەکەین ئەمەیان زۆر گرینگە ئەم خالە .

(فإن قال قائل )ئەگەر قائل بلێ (هل الأعمال شرط الصحة الايمان أو شرط الكماله)ئەوە ئەو کێشەیە کە ئەمرۆ زۆر باسی لێوە ئەکرێی ئەگەر یەکێك بلێ ئایە کردەوە وە مەبەستمان لە کردەوە کردەوەی جواریحە کردەوەی دل نیە چونکە کردەوەی دل بەتەئەکید لەلای ئەهلی سونە و جماعە بەبێ خیلاف ئەگەر نەبێ کافرە کەسەکە نمونە گەر بلێت من خوام خۆش ناوێی بلێ من رقم لەخوایە کافر دەبێ پێ .
لەدلدا دووشت هەیە : قەول و عەمەل .
قەول :بریتیە لە ئیقرار کردن بەخوا و بەمەلائیکەکانی خوا بە کیتابەکانی بە پێغەمبەران بەرۆژی دوای بەقەدەر لەدلدا قەولی دل ئەوەیە یانی ئیقرارو تەصدیق بکەی بەخوای تعالی و بەإصولی ئیمان کەوتمان معریفە و زانین و ئیقرار قەولی دلە(قلب).
عەمەلی دل(قلب) تۆ کاتێك کە ئەلێت بەلێ خوا هەیە وە مەلائیکە هەیە تۆ ئەبێت ئەو خوایە لێ بترسی وە خۆشت بوێی ئەبێت رجات پێ هەبێ ئەبێ بەگەورەی رابگریی ئەبێت تەوکولی لەسەر ببەستی هەموو ئەوشتانە بکەی کە پێ دەوتری ئەعمالی قلوب .
کەوتت خوام خۆش ناوێی با ئیقراریشی پێ بکەی کافر ئەبی کەواتە ئەبێ ئەصلی ئەمشتانەت هەبێ . گومانمان نیە کەوا ئەوشتانە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکیتر بەرز و نزم ئەکا (یزد و ینقص)بەلام ئەگەر نەبێ (إنعدام) بکا کافرە ئەو کەسە بەو مانایەی ئەگەر یەك لەئەعمالەکانی قلوب نەبێ ئەوکەسە کافرە نمونە وتی من خوام خۆش ناوێی کافرە ئەمە لەناو دلدایە .

زمان:

ئەبێت بلێ (لا اله الا الله محمد رسول الله)بەمەرجێك بتوانی بەلام ئەگەر لال بوو ئەوە جیاوازە ئەگەر وای نەوت و هیچ كێشەیەكی نەبوو وەك باسمان كرد ئەوە ئەو كەسە كافرە با لەدلیدا ئەو ئیمانەی هەبێ .

عەمەلی جواریح:

لەنوێژ لەزەكات لە رۆژوو لەحەج لەباقیتری واجبات لەموحەرەمات و نەكردنی زینا و نەكردنی قەتل نەكردنی شتەكانیتر كەموحەرەماتن ئەوەش ئیمانە ،ئەگەر كەسێك ئەمە بخاتە دائیرەیەكەوە بلێ ئەگەر ئەمانەشی نەبوو هەر موسلمانە !ئەلێن نەخێر وانیە . لەبەر ئەوەی ئەهلی سونە و جماعە هەمووی كۆدەنگن لەسەر ئەوەی كەوا ئەبێ عەمەلی جواریحی هەر هەبێ شتێكی هەر هەبێ نابێ هیچی نەبێ ئەوەیە كە پێ دەلێن جنسی عەمەل .

بۆنمونە زەكات :لەسەر قەولی ئەوكەسانەی كە دەلێن تاریكی نوێژ كافر نیە ئەوان نالێن ئەگەر هەر هیچیشی نەبێ كافرنیە  نەخێر بەلكو ئەلێن ئەبێت هەر شتێكی هەبێ یانی ئەبێ عەمەلێكی واجبی هەبێ و كردبی یان موحەرەمێكی تەرك كردبێ لەبەر خاتری خوای تعالی لەسەر شەریعەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)ئەوە ئەوكاتە تەصدیقی ئیمانەكەی كرد بەلام ئیمانەكەی لاوازە یەك شت شتێكی وانیە بەتەنها . بەلام لەسەر قەولی صەحیح ئەوەیە كە دەبێت جنسی ئەو عەمەلە نوێژ بێ ئەگەر نوێژی هەبوو ئەوە ئیمانەكەی تەصدیق كردوە بەمەرجێك قەولی قلب و قەولی زمانی هەبێ بەلام ئەگەر ئەو نوێژەی نەبوو لەسەر قەولی محقیقین و صەحابە وە لەسەر ئیجماعی صەحابە ئەگەر نوێژی نەبوو هەرچ شتێكیتری هەبێ لێ وەرناگیرێ و كافرە ئەو كەسە .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة، فمن تركها فقد كفر)[٧]یان دەفەرمووێ (إن بين الرجل وبين الشرك

[٧] : أخرجه الأمام أحمد بن حنبل في المسند بإسناده الجيد

والكفر: تركَ الصلاة)[8]یانی ئەگەر نوێژ نەبوو هەرچیەکی تر بکەی لێت وەرناگیرێ لەبەر ئەوەی نوێژ بۆخۆی نەکردنی شیرکە کەواتە تۆ هەلوەشێنەرەوەکەی ئیمانت هێنا وەکو ئەوە وایە تۆ نوێژ بکەی و رۆژوو بگریی خوات خۆشبوێ هەتا کۆتایی ئەم ئەعمالانە دواتر بەزمان کوفرێك بکەی لەسەر ئەم کوفرەش هەربرۆیی سودی نامێنی ئەوانیتر بۆیە تەرکردن و وازهێنانی نوێژ شیرکە بۆیە کاتێك ئەم ئایەتە ئەهێنن (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ)[9]ئەلێن ئەدی ئەوە نیە خوای گەروە وتویەتی من لەهەموو گوناهێك خۆش دەبم إلا شیرك نەبێ وە هیچ کاتێك لەشیرك خۆش نابم لەوانیتر خۆش دەبم گەر مەشیئەتم لەسەری بێ ؟ئەلێن ئاخر خۆ تەرکی نوێژ کەبیرە نیە لەلای ئەهلی سونە و جماعە لەلای ئەوانەی کەوا قەولی راجحیان بەدەستەوەیە راستە هەندێك لەعلماء دەلێن کوفر نیە ئەم ئایەتە دەهێننەوە و شمولی ئەمەی پێ ئەکەن بەلام قەولەکەی مرجوحە و راجح نیە .

ئایا عەمەلی جواریح مەرجە بۆ دروستیەتی ئیمان بەوامانەی ئایە ئەو عەمەلە کراوە بەمەرج بۆئەوەی کە ئیمانەکەت صەحیح بێ یانی مجزء ئاگاداربنە جیاوازی هەیە لەگەل کەمال .

ئەگەر وتمان ئیمان مەرجی صەحەیە یانی عەمەلت نەبێ کافری ئەگەر وتمان مەرجی کەمالە ئەگەر نەت بوو کافر نیت بەس ئیمانەکەت لاواز و نقصانە .

مەرجی صەحە واتا ئەو عەمەلە ئەگەر هەت بێ ئیمانەکەت صەحیحە ئەگەر نەت بێ ئیمانەکەت باطلە. کەوتمان عەمەل مەرجی صەحەیە یانی ئەو کەسە عەمەل نەکا کافرە ئیمانەکەی صەحیح نیە ئیمانەکەی باطلە.

بەلام ئەگەر وتمان مەرجی کەمالە نا یانی ئیعتقاد و قەول سودی پێ دەگەیەنی با عەمەلیشی نەبێ . کەمال واتا تەواو کەری ئیمان واتا ئیمان هەیە بەس عەمەلەکە تەواوی دەکا وە صحە یانی نیە ئەگەر ئەو عەمەلەنەبێ .

---

[8] :رواه مسلم
[9] :سورة النساء اية :٤٨

شاريح دەلیٚ(نقل الأعمال ركن في الايمان)ئەلیٚ هەلەیە ئەم كەلیمەیە كەلیمەی مەرج بەكار مەهیٚنە .

**بزانین روكن و مەرج چیە و لیٚكیان جیا بكەینەوە:**

سەیری نویٚژ بكەن دەست نویٚژ مەرجە بۆنویٚژ ئەم دەست نویٚژە لەدەرەوەی نویٚژەكەیە بۆیە ئەلیٚن مەرج ، كەواتە مەرج لەدەرەوەی مەرجكراوەكەیە ئەوەی كە مەرجی بۆ گیراوە بەلام ئەگەر نەشبیٚ نویٚژەكە بەتاڵە.

بەلام كەوتمان رووكن سەیری سورەتی فاتیحە بكەن فاتیحە روكنە لەناو نویٚژدا. كەواتە ئەم روكنە لەداخیلی شتەكەدایە وە ئەگەر نەشبیٚ بەتاڵە تۆ ئەگەر لەغەیری فاتیحە لە سورەتی البقره هەتا الناس بخویٚنی نویٚژەكەت دروست نیە . روكن واتا بونی لەناو شتەكە زۆر زۆر پیٚویستە ئەبیٚت هەبیٚ ئەگەر نەبیٚت بەتاڵە .

ئیمان دەخەینە ناو دائیرەیەكەوە :

پیٚناسەی دەكەین ئەلیٚن (إعتقاد و قول و عمل)یاخود بەدوانیەكە ئەلیٚن (قول وعمل) ئایە لەم دائیرەیە چۆتە دەرەوە ؟ ئەو پیٚناسەیە ؟

ئەگەر وتمان عەمەل یان قەول مەرجە بۆ ئیمانەكە ئەوە دەبیٚ بیخەینە خاریجی دائیرەكەوە و بیخینەدەرەوەی دائیرەكە ئایە وایە ؟ واتا مسمای ئیمانە یاخود نا؟

إسم و مسما مان هەیە ، إسم ناوكەیە بەلام مسما خودی شتەكە خۆیەتی .

ئایا ئیمان پیٚك هاتووە لەدووشت یاخود نا ؟كە قەول و عەمەلە ئەكریٚ بلیٚن قەول یاخود عەمەل لەخاریجی ئیمانە ؟نابیٚت چونكە پیٚك هاتەكەی ئیمان قەول و عەمەلە ، كەواتە ئەگەر قەول و عەمەل نەبوو ئیمان نامیٚنی .

بەلام دەبیٚ جیاوازی لەنیٚوان ئەهلی سونە و خواریج و معتەزیلە دروست بكەین:

خوارج و معتزيله ئەلێ ئەعمالی به واجبات و محرمات و مستحبات ئەبێ هەمووی وجودی هەبێ ئەگەر کەسێك تخلوف بکا لەئەعمالەکانی واجبات یان محرمات ئەوە ئەکەسە کافرە .

ئێمە وانالێن ئەهلی سونە وانالێت بۆیە سەیرکەن خواریج و معتەزیلە دەلێن عەمەل رووکنە بۆیە کاتێك کەسێکی مرجیئە دێت ئێمە دەلێن عەمەل رووکنە یەکسەر پێت ئەلێ تۆ خواریجی !ناچێ جیاوازییەکە بکا لەنێوان خواریج و معتەزیلە و ئەهلی سونە . ئاخر خواریج ومعتەزیلە دەلێن تاکەتاکەی هەموو کردەوەکان بەواجبات و محرمات هەمووی روکنە بەلام ئەهلی سونە وانالێ ،

ئێستا لەلای خواریج بەس درۆ بکەی تۆ کافری بەلام ئەهلی سونە وانیە .

بزانین لەلای زانایانی ئەهلی سونە کە وشەی مەرج(الشرط)کەبەکاریان هێناوە چۆن بووە و مەبەستیان چیە وە ئەوانەشی دەلێن بەکاری مەیهێنن بۆ !

لێرەدا شاریح دەلێ (الأعمال رکن في الایمان ولیس شرط صحة ولا کمال)ئەلێ تۆی داخوازی زانستی شەرعی کاتێك پێناسەی ئیمان دەکەی مەلێ مەرجی صحه و مەرجی کەمال ئەمانە فرێی بدە بلێ عەمەل رووکنە قەول و عەمەل تەواو ،چۆن ئەلێ ئینسان رۆح و جەسەدە بەبێ جەسەد رۆح نابێ وەبەبێ رۆحیش جەسەد نابێ ئەمیش بەم شێوەیەیە روکنە .

بەلام لێرە ئەبێ ئاگاداربین کاتێك کە دەلێن کەلیمەی (شرط)بەکار نەهێنین بۆ؟

(فمن قال العمل شرط الإیمان قلنا هذا خطأ)ئەمە بیروبۆچونی شیخ سەعدە(قلنا هذا خطأ لأن الأعمال جزء من الإیمان) بۆنمونە تۆ سەیری کە فاتحیە داخیلی شتەکەیە کە جزئێکە لەنوێژەکە بەلام ئەو جزئە جۆرەکە روکنە یان واجبە یان موستەحەبە کامیانە ؟رونکە فاتیحە لەناو نوێژ کەواتە مەرج نیە هەر شتێك جزء بوو تۆ یەکسەر بلێ رووکن نیە نەخێر وانیە ، ئەهلی إرجاء تفصیل نادەن ، پرسیاریشیان لێ بکە عەمەل چیە پێت ئەلێن جزء بەس لێ بپرسە ئایە جزئیەتی ئەم عەمەلە روکنە یان واجبە یان مستحەبە ؟هیچ کاتێك پێت نالێ

رووكنه چونكه كه ئەلێ ئەگەر پێم وتی رووكنه یانی قسەكەی من هەلدەوشێنیەوە كاتێك من دەلێم تەركی عەمەلیش بكا كافر نابێ مورجیئەكان وادەلێن .

دواتر شێخ سعد دەلێ (أما الشرط فيكون قبل الشيء ولا يكون من أجزائه)ئێستا دەست نوێژ جزئیكه لەنوێژەكه ؟نەخێر بەلكو لەدەرەوەی نوێژەكەیه خۆتۆ لەناو نوێژەكەدا دەست نوێژ ناگری كەواته داخیلی نوێژەكه ئەوشتانەی پێویستن له روكن و واجب مستحەبی نوێژەكه دیاره، كەواته دەست نوێژ لەمەرجدا(الشرط) باس دەكرێی خاریجی نوێژەكەیه بۆیه پێت ئەلێ (أما الشرط فيكون قبل الشيء)پێش نوێژەكه دەست نوێژه (ولا يكون من أجزائه)دەست نوێژەكه جزئێك نیه لەنوێژەكه (فالطهارة شرط للصلاة)نالی روكن بەلكو دەلێ مەرج ئەمه پێناسەیه له الاصول فقهدا پێمان دەلێ (فهل جزء من الصلاة )نەخێر جزء نیه ( أو أمر مستقل سابق لها )ئیشێكی سەربەخۆیه لەپێش نوێژەكەدا كراوه .

(فحينئذ الشرط يكون سابقاً أو مقارناً ويكون فعلاً مستقلاً بينما الركن جزء من الماهية)روكن بەشێكه لەخودی شتەكه خۆیی (فالركوع ركن للصلاة لأنه جزء منها)ئێستا ركوع جزئێكه لەنوێژەكه روكوع لەناو نوێژدا روكنه چونكه ئەگەر تۆ ئەو روكوعه تەرك بكەی نوێژەكەت بەتاله . ئەركانەكانی نوێژ (فاتحه ، روكع و سوجدە،،، هەتا دوای )

(وهاكذا الأقول والإعتقادات والأعمال ركن من الايمان)ئینجا ئەلێ ئیمان ئەگەر پێناسەی بكەین به ئەركانەكانی پێناسەی دەكەین دەلێن إعتقاد و ئەقوال و ئەعمال هەمووی رووكنه لەئیمانه ،

بەلام ئاگاداربن بۆنمونه لەئەقەوال له وته زۆرمان هەیه هەمووی روكن نیه بەلكو (لا اله الا الله محمد رسول الله) روكنه هەرچی قورئان و سونه تۆبیخوێنی بەس تۆ بلێ من نالێم (لا اله الا الله محمد رسول الله)ئیمانەكەت لێ وەرناگیری و ئیماندار نیت بەس كه ئەوەت وت ئەوانیتر واجبات و موستەحەباته .

عەمەلیش:ئەبێت إلا عەمەلت هەبێ جا عەمەلی فعلی بێ یاخود عەمەلی تەرکی یانی ئەبێ إلا لە ئەعماله واجبەکان تۆ عەمەلەکت هەبێ یاخود لەتەرکیەکان کە ئەبێت تەرکی بکەی زینا یاخود خواردنەوەی ئارەق ئەبێ شتێك لەمانە لەبەر خاتری خوای گەروە تەرك بکەی ئەوە تەصدیقی ئیمانەکەت کرد و عەمەلت هەبوو وەك وتمان ئەمە قەولێکی مرجوحە و راجح نیە بەلکو قەولی راجح إلا ئەبێت نوێژت هەبێ.

کەواتە سەرنجمی هەردوو قەولەکە عەمەلی کرد بەروکن بەلام نەك هەموو تاکەبەتاکەی عەمەلەکان .

بەلام خواریج و معتەزیلە وانالێ بەلکو دەلێن هەمووی روکنە عەمەل بەلام مرجیئە دەلێن گەر عەمەلیشی نەبێ هەر ئیمانداره بەلام ئەهلی سونە لەنێوان ئەلێن ئیمان ئیعتقاد و قەول و عەمەلە وە عەمەل نوێژئەوە رووکنی عەمەلە وە ئەبێت ئەو نوێژەت هەبێ ئەگەر نەت بێ ئیمانت نیە هەتاوەکو هەرچ کارێکیتر بکەی .وە هەیەلە زانایانی ئەهلی سونە ئەلێن ئەگەر نوێژیش نەکا کافر نیە بەس ئەبێ عەمەلێکی هەبێ بۆیە هەیە لە خوازیارانی زانستی شەرعی دەلێ مادەم بە نوێژ کافر نەبوو ئەگەر هیچ عەمەلیشی نەبێ کافر نابێ ! نەخێرکاکە تۆ ئەمەت لەخۆوە هێنا ، ئیمامی شافعی ئیجماعی صەحابە نەقل دەکا (الإيمان قول وعمل ونية لا بجزيء واحد من الثلاث إلا بالآخر ")[10]یانی لەخانەی عەمەل تۆ سفر بی تۆ دۆرایت و تەواو ئەبێ لەهەر سێ خانەکەدا ئیعتقاد و قەول و عەمەل شت هەبێ .

بەس ئەمان هاتون تنفیقیان کردوە لەبەینی قەولی ئەهلی سونە و قەولی مورجیئە دێن ئەلێن ئیمان قەول و عەمەلە دواتر ئەلێن ئەگەرعەمەلیشت نەبێ هەر موسلمانی ! ئێ تۆ نالێت ئیمان قەول و عەمەلە؟ یان وەکو مورجیئە بلێ عەمەل لەئیماندا نیە یان وەکو ئەهلی سونە کەوتت ئیمانە ئێ ئەبێ

[10] قال اللالكائي رحمه الله في شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة (٩٥٦/٥) (١٥٩٣):

**ئیسپاتی بکەی ئیسپاتی بکە هیچیان ناکەن یەکێك لەوانە وەکو صالح فوزان ناویان ئەنێ طائیفەی پێنجەم لە مورجیئە.**

**طائیفەی پێنجەم لە مورجیئە ئەوانن کە ئەلێن عەمەل مەرجی کەماڵە .**

**شێخ سعد دەڵێ (الإيمان بمثابة الشجرة) ئیمانە وەك دارێك وایە نمونەمان بۆ دەهێنێتەوە بەدارێك شێخ دارەکە (منها ما هو من الأوراق)ئێستا دارتان بینیوە هەیە گەڵایە (الأوراق ومنها ما هو من الأغصان)هەشە پەلەکەکانە (ومنها ما هو من الجذور)هەیە رەگەکەیەتی (والكل حكمه)هەریەك لەمانە حوکمی خۆی هەیە (فمثلا السنن الرواتب[11] هذه من الإيمان لكن ركن مكمل ولا يزول الإيمان)جائەو لێرەدا لەسەرئەوە دەروا کە عەمەل هەمووی روکنە ئەیکا بەدووبەشەوە**

**روکنی مکل وە روکنێکمان هەیە بەنەبونی ئیمانەکە نامێنی بەس کە وتت روکن مکمل ئەگەر سنن رواتبت نەبێ کافر نابی بۆیە پێ وت مکمل (ولا يزول الإيمان بذهابها)ئیمانەکە بەرۆیشتنی ئەو رەواتبانە ئیمانەکە ناروا (لكن الإيمان ينقص)بەلام ئیمانەکە نەقص دەبێ (كما أن الشجرة تنقص بذهاب بعض أوراقها)هەروەکو دار هەندێك لەگەلاکانی بروا دارەکە کەم دەبێتەوە ، ئێستا تۆ دارێکی جوان بێنە گەلا و هەمووشتەکانی پێوە بێ بەڵام برۆ نیوەی گەلاکان لێبکەرەوە ئەلێ ئەو دارە نوقصانە بەلام نالێت دار نیە ئەلێت دارە چونکە گەلاکان خۆی لەخۆیدا روکنی ئەساسی دارەکە نیە .( ولا ننفي اسم الشجرة عنها بنقص بعض الورق)هەندێك لە وەرەقەکە لەدارەکە رۆیشتووە ناوی نابەین بلێن ئەوە دار نیە .**

**کەلیمەی مەرج (الشرط)کە ئەلێت نابێ وابلێن ئەم قەولە لەروانگە ئصولیەکەوە وایە بەڵام ئایا لەئەهلی سونە ئەمەیان بەکار هێناوە یان نا ؟**

**ئەلێن بەلێ بەکار هاتووە نەك بۆ ئەم مەسەلەیە بەلکو بۆ (لا اله الا الله) بەکار هاتووە ئەلێن شروطی (الا اله الا الله)کە وتیان شروط مەبەستیان خاریجی (لا**

---

[11] : یانی ئەو نوێژانەی کە لە پشت و پێشی نوێژە فەرەزەکان هەیە و پێوەیەتی و دائیمەیەتی سونەتەکان

اله الا الله)یەکەیە ؟ نەخێر مەبەستیان معنا ئصولیەکە نیە ئەڵێ (لابد) بەمەرج گیراوە ئەبێ ئەم شتانە هەبێ لە (لا اله الا الله)

مەرجەکانیشی وەك لەم شیعرەدا هاتوە :

(العلم واليقين والقبولُ *** والانقيادُ فادْرِ ما أقولُ

والصدق والإخلاص والمحبهْ *** وفقك الله لما أحبّه)

ئەمە هەر حەوت مەرجەکەی (لا اله الا الله بوو) کە وتویان مەرجی (لا اله الا الله) مەبەستیان نیە کە لەداخاریجی (لا اله الا الله)یە .

إبن القيم (رحمه الله) دەفەرمووی: (الصلاة شرط لصحة الإيمان)[١٢]ئەڵێ نوێژ مەرجی دورستیەتی ئیمانە بەو مانایەی ئەگەر نوێژ نەکەی ئیمانت نیە .کەلیمەی مەرجی بەکار هێنا.

کەواتە لەم بابەتە ئەبێت فروان بین ئەوانەی ئەڵێن نابێت کەلیمەی مەرج بەکار بهێنی چونکە روکنە ئەڵێن ئەزانین مەبەستان چیە جزاك الله خيرا بۆمان دەرکەوتوە کەوا بابەتی عەمەل خاریجی مسمای ئیمان نیە بەلکو داخیلی مسمای ئیمانە لە مسمای ئیمانە و لەمەبەستان تێ گەیشتین بەس ئەوانەشی کە ئەڵێن عەمەل مەرجی صحە و کەمالە ئەیانەوێی بەم تەفریقە ئەهلی سونە لە خەواریج و مورجیئە جیابکەنەوە بەمورجیئەکان بلێن ئێوە هەموو عەمەلتان کردوە بەمەرج ئەڵێن هەمووی مەرجی کەمالە نەخێر وانیە جەماعەتی خواریج کە ئێوەش ئەڵێن هەمووی بریتیە لە مەرجی صحە ئەڵێن وانیە بۆئەویە بۆ خەلکی روونی بکەینەوە ئەڵێن لە ئەعمال هەیە مەرجی صحەیە وە لە ئەعەمال هەیە مەرجی کەمالە .

مەرجی صحە ئەوەیە کە وەکو ئیجماعی صەحابە و زۆربەی زانایانی ئەهلی سونە لەوانە ابن القيم و ابن تيميه دەڵێن : ئەگەر نوێژ نەبێ ئیمان نیە کەواتە مەرجی صەحەتی ئیمان نوێژە لەعەمەلی جواریح.

---

[١٢] : كتاب الصلاة وحكم تاركها ( ص ١٦ )

ئێمە بۆخۆمان ئەلێن :ئیمان قەول و عەمەلە (لابد من العمل) بەبێ عەمەل نابێ

کیتابێك دەرچووە لەسەر هەلەکانی إبن حجر لەفتح الباریدا سەبارەت بەکەلیمەی (الشرط صحة وشرط الکمال)زۆرێك لەزانایان پێداچوونەوەیان بەم کیتابە کردوە کە شێخ عبدالعزیز شبل نوسیویەتی رەدی لە إبن حجر داوەتەوە کاتێك کە دەلێت :فارق لەنێوان سەلەف و معتەزیلە ولەنێوان خەواریجدا چیەئەوەیە کە معتەزیلە و خەواریج عەمەلیان کردوە بە مەرجی صحە سەلەف ئەیکا بەمەرجی کەمال !

١-پێیان ئەلێن ئەو سەلەفەی إبن حجر باسی کردوە مەبەستی پێ ئەهلی سونە و جەماعە نیە مەبەستی پێ سەلەفی ئەشاعیرەیە چونکە سەیری إبن حجر بکە لەکیتابەکەیدا ئەلێ ئەوەی بلێ خوا (علی العرش ستوی )ئەلێ ئەوە مجسیمەیە یاخود مفویضە ناودەنێ سەلەف لەبەر ئەوە بۆمان دەرکەوت إبن حجر لە فتح الباریدا من ئامۆژگاری هەموو یەکێك لەئێوە دەکەم بگەرێتەوە بۆ ئەم کیتابە کە هەلەکانی باس دەکا بەسەر پەرشتی شیخ بن باز و فوزان و علماء هیئی کباری یەك لەو هەلانەی کە گرتویانە لە إبن حجر مەسەلەی تەعریفی ئیمانە ئینجا لەویدا باس دەکا ئیقرار بەوە دەکا ئەلێ ئەلێ هەموو عەمەل مەرجی کەمال نیە نوێژ مەرجی صحەیە باقیەکانیتر مەرجی کەمالە .

بێنە لای حافظ حەکەمی لەشرحی سلم أصول لەمعاریج القبول وتویەتی : سەلەف زۆربەیان هەمو عەمالیان بەمەرجی صحە داناوە کەواتە ئەویش مەرجی بەکار هێنا .

بۆیە کاتێك هەندێك لە ئەهلی عیلم دەلێن بەکار هێنانی کەلیمەی مەرج هەلەیە ئەلێن بەلی لەلایەنی ئسولیەکەیەوە هەلەیە ئەما بۆ روونکردنەوە بۆئەوەی خەلك تێ بگا هاتووە لەکەلامی سابقین ولاحقینیش .

## زیاد و کەم بوونی ئیمان :

ئیمامی ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێی بێت)هەروەکو ئیجماعی ئەهلی سونە و جماعە ئەویشیان عقیدەکەی وایە کەوا ئیمان زیاد ئەبێت و کەم دەبێت بە خیلافی ئەهلی بیدعە کە ئەلێن نەزیاد ئەبێت وەنەکەم دەبێت ، بەلکو دەلێن ئیمان یەك شتە نەزیاد ئەبێت وەنە کەم دەبێت .

شێخ سعد دەلیٚ(قال المؤليف زيد وينقص)تەبعەن موئەلیفەکە ئیمامی ئەحمەدە وتویەتی (كما جاء في الخبر (أكمل المؤمنين ، إيمانا أحسنهم خلقا ))سەیری ئیمامی ئەحمەد بکەن (رەحمەتی خوای لیٚ بێت )ئەم فەرموودەی هێنا لەسەر زیادە و کەم بوونی ئیمان کە سەیری دەکەین دەلیٚ (أكمل المؤمنين ، إيمانا أحسنهم خلقا)لێرە بۆ ئەکمەل رۆیی یانی نصوصەکان سەیر بکەین لەکیتاب وسونەدا هەمووی باسی زیادەی ئیمانی تێدایە باسی کەمبوونی تێدا نیە .

نالێن تێدا نیە بەس بەنەص نیە بۆنمونە خوای گەورە دفەرمووی (لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ)[١٣]ئەلێن ئەگەر شت زیاد بکا قابیلی کەم بوونەوەیە ،ئەگەر زیاد بکا خۆی لەپێشتردا واتا کەم بووە وە لەبابی دلالەی تالازوم ئەگەر بێتوو ئەوشتە زیاد بکا بەتەئەکید کەم دەکا .

ئەم فەرمودەش کەهێنایەوە واتا تەواوترینی ئیماندار ئەوانەن کە ئەخلاقیان جوانە.

بەداخەوە هەبوون لەسەر مینبەر ئەم دەلیلەیان دەگرت بەدەستەوە لەسەر ئەوەی کەوا عەمەل مەرجی کەمالە بەداخەوە کە لەکاتێکدا ئیجماعی سەلەف لەسەرئەوەیە کە هەیەتی مەرجی صحەیە هەشە مەرجی کەمالە ، وەکو وتمان عەمەل روکنی ئیمانە بەلام ئەم روکنیەتیە هەندێك لەئەهلی عیلم دەلێن روکنمان هەیە ئیمان بەبیٚ ئەو روکنە نابێت بەهیچ شێوەیەك روکنیشمان هەیە وەك بلیٚ زیادەیە لەبابی روکنیەت نیە وەك ئەمەی تۆ بلیٚ ئەگەر نەبوو نابیٚ ئەویش واجبات و موستحەباتە یانی ئەرکانمان هەیە واجباتمان هەیە و

---

[١٣] :سورة الفتح اية :٤

موستەحەباتمان هەیە وەکو وتمان هەندێك لەئەهلی عیلم تەعبیری داوەتەوە بەمەرجی صحە و مەرجی کەمال . وە هەندێکیتر لە ئەهلی عیلم ئەلێن نەخێر با ئەوە بەکار نەهێنین ئەمە هەڵەیە هەروەکو شێخ سعد فەرمووی (الأعمال رکن في الإيمان وليست شرط صحة ولا شرط كمال).

ئیمان زیاد دەکا و کەم دەکا شێخ دەفەرمووی (الإيمان يزيد إذا فعل العباد الطاعة)ئەگەر ئیماندار هەلسا تاعەتی کرد ئەوە ئەو ئیمانە زیاد دەبێت ،بەتەئەکید هەمووومان ئەوەمان هەست پێکردوە ، تۆ برۆ بۆ مەجلیسێکی عیلم هەست دەکەیت بەرز دەبێتەوە بڕۆرە مەجلیسێکی فاحیشە پەنا دەگرین بەخوای گەورە هەست دەکەیت نرم بوویتەوە خۆت رقت لەخۆت دەبێتەوە (يدل على ذلك قوله تعالى)بەلگەش لەزیادەی ئیمان ئەم ئایەتەی هێناوە شێخ (لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ)[14] ئەگەر سەیری ئەم سورەتە بکەین باسی ئەوەمان بۆ دەکا با ئایەتەکە هەموو بێنین و باسی بکەین بزانین چی دەڵێ :
(هوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا)[15] خوای تعالی دەفەرمووی (هوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ)خوایە کەوا ئۆقرەی و ئارامی لەدلی موسلمانان دانا لەوکاتەدا لەحودەیبیە (وسكنت ورسخ القين فيها)( هوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ)لەبەر چی ؟( لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ)سەیری تەفسیرەکە بکەن (هو الله أنزل طمأنية في قلوب المؤمنين بالله والرسول الله في يوم الحوديبية فسكنت ورسخت في يقين ويزداد تصديقا لله وتباع لرسول مع تصديقهم وتباعهم ولله سبحانه وتعالى جند السماوات والارض ينصر بهم عيبادهم مؤمنين وكان الله علم بصالح خلقهم حكما في تدبير وصبره)کەواتە ئەو ئیمانەی کە هەیانبوو بەهۆی ئەوەی کە خوای تعالی نەصرێکی باشی پێ بەخشین هەتاوەکو زانایان دەفەرموون حودیبیە خۆی فەتح

[14] :سورة الفتح اية :٤
[15] :سورة الفتح اية :٤

بوو ئەمە وای کرد ئەم ئیمانەی کە موسلمانان پێشتر هەیان بوو لەگەڵ ئەو فەتحەدا کە حودیبیە بوو لەسەر قەولی ئەم زانایانی کە دەڵێن خوّی فەتحێك بوو ئیمانیان زیادی کرد جا ئەوە بەلگەیە لەسەر زیاد بوونی ئیمان بەئایەت .

شێخ سعد دەلێ (والنصوص في هذا كثيرة ولأنه إذا كان يزداد فمعناه أنه ينقص من باب دلالة التلازم)ئایەت لەسەر ئەمە زۆرن وە ئەگەر بێتوو زیاد بکا بەتەئەکید کەمیش دەکا ئیمان .

جۆرەکانی دەلالەت :

دەلالەتمان هەیە موتابەقەیە و هەشمانە تەضمونە وە هەشمانە لزومە .

دەلالەتی موتابەق : (دلالت لفض على كل معناهم)یانی کاتێك کە تۆ شتێك باس دەکەی پێناسەی شتەکە هەرهەموو دەکەی ئەوە موتابەقەیە .

دەلالەتی تەضمون:(بعض المعنها)بەشێکی نەك هەمووی واتا بەشێك لەماناکەیت باس کرد ئەوە دەلالەتی تەضمونیە.

دەلالەتی لزوم: دەلالەتی زمانە لەسەر شتێکی تر (يلزم ليهذا وجود صفة وجود ذلك شيء اخر)یانی وجودی ئەوشتەت باس کرد خۆی ئەوە دەگەیەنێ کە شتێکیتر هەیە جا لێرەدا نمونەیان هێناوەتەوە بەشێك لەزانایان نمونە ئەهێنەوە بە ئینسان ئەلێ (الانسان حيوان ناطق)ئەوە دەلالەتی متابەقەیە یانی کاهینێکی بەوتەیە و قسەئەکا بۆئەوەی لە حیواناتی جیابکەنەوە ئەگەر بلێن ئینسان حەیوانە لەگەڵ حەیوان جیانابێتەوە بەس کە وتت ناطقە لەگەڵ حەیوان جیادەبێتەوە کەواتە پێناسەیەکی جامعت کرد کە ئینسان لە حەیوان جیابکەیتەوەبەس ئەگەر وتت ئینسان کاهینە یاخود حەیوانەئەوە تەضمونە،ئەگەر وتت ئەخوا و ئەخەوێت ئەوە تەلازومە .

هەندێك لەزانایان نمونەیان هێناوەتەوە بە ناوی رەحمی خوای گەورە(الرحيم)ئەگەر ئێمە رەحیم سەیر بکەین بە دەلالەی موتابەقە دووشت دەگەیەنێ زاتی خوا لەگەڵ سیفەتی رەحمەت ئەمە دەلالەی تطابقە بۆ رحیم .

هەروەها ئەگەر بلێن رەحیم دەلالەت لە رحمە ئەکا ئەوە تەضمونە.

ئەگەر بلێن رحیم حەیاتی هەیە و ئیرادەی هەیە ئەوە تەلازومە .
جالێرەدا کە ئەمەی کەهێناوە (یزد وینقص )یانی (إذا کان یزداد فمعناه أنە ینقص من باب دلالة التلازم)
هێناویەتی کەوا (یقول شیخ الاسلام فی الایمان : ولهذا کان اهل السنة والحدیث علی أنە یتفاضل)تفاضلیان هێناوە یانی زیادە ئەبێ کەلیمەی زیادە و نقصانیان بەکار نەهێناوە بەس زیادە .لەبەر ئەوەی (وجمهورهم یقولون یزدوها)وە زۆربەی زۆریشیان دەلێن (یزد وینقص)ئەم کەلیمەیە واریدە .
(ومنهم یقلون یزد ولا یقولون ینقص)هەیە ئەلێ ئیمان زیاد ئەبێ نالێ نوقصان ئەبێ کەلیمەی نوقصان ئەبێت باس ناکا هەرلەئەهلی سونەیە وەکو لەئیمامی مالك دەیگێرنەوە (کما یقول مالك عن إحد روایتین)یانی ریوایەتێکی هەیە ئەلێ (یزد وینقص)ریوایەتێکیتریشی هەیە ئەلێ(یزید)بەس نالێ ینقص ئێستا باسی ئەوە دەکەین لەم کیتابەدا تحیقێکی زۆر موهیم کراوە .
(ومنهم من یقول یتفاضل . کعبدالله بن مبارك وقد ثبت لفض زیادة ونقصان منهم عن صحابة ولم یعرف منە من عن صحابة)لەصەحابە خیلاف نیە کە کەلیمەی زیادە و نوقصان هاتووە ، جا ئێمە زۆر وریا بین کاتێك کە صەحابە شتێکی وتو خیلاف نەبوو با ئێمە خۆمان بەوە ببەستینەوە یانی ئێستاکێشەکە لەوەدایە کە کێشەی تاریکی نوێژیشمان هەیە صەحابە هیچ خیلافێك لەنێوانیاندا نەبووە کە تاریکی نوێژ کافرە دوای خیلاف دروست دەبێ کەچی سەیر دەکەین هەرکەسێك قسە ئەکا ئەلێ زۆربەی زۆری زانایان ئەلێن کافر نیە !!وا لە گویگر دەکەن کەبترسێ بەتەئەکید ئێمە کەوتوینەتە ئەم حالەتەوە کاتی خۆیی ! وە ئێمە هەتاوەکو رۆژێك لەرۆژان بە فەزلی خوای تعالی لەسەرەتایی زانستخوازیمانەوە لەسەرقەولی صەحیح بووین کە تاریکی نوێژ کافرە لەسەر ئیجماعی صەحابە بوین . دواتر کیتاب و ریسالە دەرکەوت کەوا وتیان جمهورێکی زۆر لە زانایان ئەلێن کافر نیە !ئینجا ئەترسی خوایە نەبین بە خواریج ! تەکفیری کەسێك بکەین کە معاصی کردبێت نەك شیرك . کەچی

دواتر كە ئەگەڕێتەوە و سەیر دەكەیت ئەو بابەتە وانیە كە وا شەرحیان كردوە صەحابە گشتیان بلێن كافرە من چیم شوێن دوای صەحابە بكەوم ! .

ئەمیش هەمان شتە (ومنهم من يقول يتفاضل . كعبدالله بن مبارك وقد ثبت لفض زيادة ونقصان منهم عن صحابة ولم يعرف منه عن المخالفة من صحابة إلي أنقاد وهذا أمرا يجده مؤمين وإذا تليت عليهم آياته زادة في قلبه)ئەم بابەتەش كە كاتێك تۆ قورئانت بۆ ئەخوێنرێتەوە لەدەرسێكی عیلمیدا بەكیتاب و سونە دیراسە دەكەی (إذا تليت عليهم آياته زادة في قلبه بفهم القران ومعرفة معانه من علم الايمان مالم يكن )رۆژ بەرۆژ تۆ لەم دەرسانەدا ئیمانت زیاد ئەبێ (حتى كان لم يسمع ايات إلا حين إذين)جاری وایە چەندەها جار ئایەت ئەبستیتەوە كەچی لەدەرسێكدا باسی ئەو ئایەتت بۆ دەكا وەكو ئەوە وابێ تەنها ئەمجارەیە و یەكەمجارە ئەم ئایەتەت بیستبێ (ويحصل فى قلبه من رغبة في خير من رهبة من الشر مالم يكن )لەكاتی ئەم مەجلیسەدا جاری وایە شتەكە دووبارەبوونەوەیە بۆتۆ كەچی بە شێوەیەك و بەئسلوبێك پێت ئەدرێی ئیمانت زۆر بەرز دەبێتەوە كە دەرئەچێ ئەڵێ خۆ باشە من ئەم شتەم زانیوە لەپێشتردا كەچی سبحان الله لەم مەجلیسەدا ئیمانت پێ زیاد بووە .

(فزاد حب الله ومحبة وطاعة وهذا زيادة الايمان)ئەمە قەولی شيخ الاسلام ابن تیمەیە . پاشان دەڵێ (وإثبات كون الايمان يزد وينقص هو مذهب اهل السنة والجماعة).

شێخ سعد دەڵێ :ئیمان زیاد و نوقصان دەكا بەتەئەكید ئەمە مەزهەبەی ئەهلی سونە وجەماعەیە (وهو مذهب أهل السنة والجماعة خلافاً للمرجئة الذين يَرَوْن أن الأعمال لا تدخل في مسمى الإيمان)تەبعەن مورجیئە بە هەموو گروپەكانیانەوە دەڵێن ئەعمال ناچێتە موسەمای ئیمان .

مسمای ئیمان واتا: ئیمان خۆی ئەگەر ئێمە پێناسەی بكەین ئیمان قەول و عەمەلە كەچی مورجیئە هەموویان نالێن عەمەلە وە عەمەل ناكەن بەئیمان .ئێستاش كە گروپێك پەیابوون ئەلێن ئیمان قول و عەمەلە بەس بەبێ

عەمەلیش دەبێ علماء ئەلێن ئەمانە تلقیفیان کردوە بە لەنێوان قەولی سەلەف وقەولی مورجیئە یانی نەقەولی سەلەفیان هەلبژارد بەتەواوی نەقەولی مورجیئەش بەلام هەر پێیان ئەوترێ مورجیئە ئاگاداربن نابن بەئەهلی سونە.

کەسانیی پێشتریش هەبوون شەبابە کوری سەواری مەدائینی ئەلێ (إذا قال عمل)تەقریبەن ئەوان ئەچنەوە سەر ئەوان کەوتویەتی قەول و عەمەلە بەس وتویەتی (إذا قال عمل).

ئێمە إسم و موسمامان هەیە ، ئیمان إسم بەس موسەمای ئیمان یانی ئەوەی پێوتراوە ئیمان چیە وتا ئەوەی ناوبراوە بەئیمانەکە چیە . بۆنمونە ئێستا تۆ ناوت عمرە ئەوە ناوەکەتە بەس خودی خۆت موسمای خۆتە .

ئەلێ ئیمان قەول و عەمەلە ئینجا وەرە با پێناسەی بکەین بزانین مسمای عەمەل چیە :کاتێك کە تۆ عەمەل لە مسمای ئیمان دەرئەکەیتە دەرەوە مانای وایە تۆ عەمەلت نەکرد بە ئیمان .

ئەلی ئەسماء و موسماتمان هەیە خوای تبارك وتعالی هەموو ئەسماء تاکانی فێرە ئادەم کرد (وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَٰؤُلَاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ)[١٦]( هَٰؤُلَاءِ)موسەماتەکانە یانی ئیستا وتویەتی ئەوە چیە ئەوە موسەماتەکانە ئیسمەکەی ئەوەیە .

جا ئێمە ئەسماء ئەحکامان هەیە لەبابەتی عقیدە ئیماندار موسلمان موحسین موشریك کافر مونافیق زندیق هەتا ئاخیری ئەمانە ئەسمائن ئەحکامی ئەمانە چیە ، هەروەها دەلێن ئەمانە إسمن موسلەمایی ئەمانە چیە ،ئێستا تۆ ئەلێ موسلمان ئادەی پێم بلێ موسلمان کێ یە .

جا مورجیئە عەمەل لە موسمای ئیمان دەر ئەکەن (القولون بأن الإيمان لا يزيد ولا ينقص وقد تركوا هذه ضواهرة نصوص سابق التي تدول علي دخول الايمان في مسما الايمان وتدل علي أن الايمان يزد)ئەمان ئەمانەیان بەجێهیشت وازیان لەم نصوصانە هێنا کە دەلالەت لەوە دەکا عەمەل ئەچێتە ناو موسمای ئیمانەوە

---

[١٦] :سورة البقرة اية ٣١:

وە ئیمانیش زیاد ئەبێ (فمن ثم هل بأن الإیمان یزید وینقص یعد إجماعاً)شێخ سعد پرسیارێك ئەكا ئەڵێ :ئایا كەوایە ئێمە ئەڵێن ئیمان یزد وینقص ئایە ئەمە ئیجماعی ئەهلی سونە و جەماعەیە یاخود نا ؟ یاخود خیلافێك هەیە ؟ ابن تیمیە و ئیمامی مالك دووریوایەتیان هەیە ، كەواتە ئیجماع نیە چونكە كەسێك هەیە ئەڵێ وانیە (فكیف نجمع بینه وبین قول الإمام مالك الإیمان یزید فقط؟)ئەگەر وابێ ئیجماع بێ ئێمە چۆن تەوفیق لەگەل قەولی ئیمامی مالك لەگەل ئەو قەولەدا بكەین كە ئەڵێ ئیجماعە ، ئیمامی مالیك خیلاڤی جیگای إعتبارە بەلام شیعە جێگای إعتبار نیە ئێستا ئەڵێن (مسح كردن لەسەر خوف )ئیجماعە تۆبێت بلێ شیعە ئەلێن نا ئەلێن ئیعتبار بۆ ئەوانە ناكرێ ئیعتبار بە ئەهلی بیدع ناكرێ . لێرە شێخ دەڵێ ئەگەر وابێ چۆن ئیمامی مالك وادەڵێ ؟

وەلامەكەی :

شێخ سعد دەڵێ (: إثبات الزیادة تواترت به النصوص كتاباً وسنة)لەوانەیە پێت سەیر بێت بلێ چۆن لە ریوایەتێكدا ئیمامی مالك باسی نوقصان ناكا ئەڵێ لەبەر ئەوەی كەلیمەی زیادە (تواترت به النصوص كتاباً وسنة)لەكیتاب و سونە بەتواتری هاتووە (وإثبات النقص من لازم الأول)كەمادەم زیادە بكا نوقسانیش دەكا بادەلیلیشمان نەبێ لەقورئان كە كەم نەكا .چۆن وتی ( لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ)[١٧]مادەم وایە ئەبێ بلێ كەم دەبێ با نەصێكی واشمان نەبێ ، مادەم زیاد ئەكا بەتەئەكید كەم ئەبێ (والإمام مالك أو بعض من نفی النقصان)ئیمامی مالك بێ یاخود غەیری ئیمامی مالك كەباسی نوقصانی ناكا (من نفی النقصان نفی اللفظ)نەهاتووە حەقیقەتی شتەكە نەڤی بكا وەكو بلێ نەخێر كەم نابێ ،ئەڵێ یزد وینقص ئەڵێ ینقصەكە نالێم ئەڵێ دەلیلمان نیە

---

[١٧] :سورة الفتح ایة :٤

بەلفظ بلێ ینقص  (فقال: أنا لا أقول ینقص لکنه لا یزید أو تقل زیادته أو تذهب زیادته ومن هنا فالسلف متفقون علی أن الإیمان یزید وینقص والخلاف بینهم في اللفظ فقط) جوابەکەی شێخ ئەوەیە هاتووە ئیعتباری بۆ ریوایەتێکی کردوە ئەو ریوایەتەی بۆ باسکردووین ، وتویەتی مەبەستی ئیمام مالك ئەوە نەبووە کە حەقیقەتی نوقصانی نیە وتویەتی وەکو لفظ نالێم ئەگەرنا مادەم زیاد بکا کەمیش دەبێ .

شێخ دەلێ (واستدل المؤلیف علی کون الایمان یزد وینقص بقول صلی الله علیه وسلم)ئەلێ ئیمامی ئەحمەد بەمە دەلیلی هێنایەوە (**أکمل المؤمنین ، إیمانا أحسنهم خلقا**) ونصوص فی هذاعدیدة)ئەگەر ئێمە بگەرێنەوە نصوص زۆر زۆرە ،ئەگەر بێتوو أکمل بێ نوقصانیشمان هەیە .

شێخ عبدالعزیز بن عبد المحسین البدری لەکیتابی(زیادةالإیمان ونقصانه وحکم الاستثناء فیه)دا دەلێ و ئیجماع نەقل دەکا لەسەر زیاد بون و کەم بوونی ئیمان و دەلێ (لقد حاء في کتاب الله عز وجل  نصوص کثیرة تدل علی زیادة الإیمان ونقصانه وأن أهل المتفاضلون فیه بعضهم أکمل إیمانا من بعض، منهم السابق بالخیرات ، ومنهم المقتصد، ومنهم الظالم لنفسه ، منهم المحسن، ومنهم المؤمن ، ومنهم المسلم ،لیسوا فی الدین سواء فی مرتبة واحدة ، بل فضل الله بعضهم علی بعض ورفع بعضهم فوق بعض درجات .

وقبل الشروع فی ّذکر هذه الأدلة القرانیة الدالة علی زیادة الإیمان ونقصانه أود التنبیه علی نقطة هامة .وهی :

أن کل دلیل دل علی زیادة الإیمان فهو یدل علی نقصانه،)ئەوە گرینگە هەر دەلیلێکمان لە کیتاب و سونە کە زۆرزۆرە ئەگەرلەسەر زیادە هاتبێ لەدەلالەی تلازوم (وکذا العکس ، فیها دل علي نقصان الإیمان فهو یدل علي زیادته، فالایات التی اوردها هنا وظاهرها الدلالة علی زیادة الإیمان فقط ، فهی تدل علی نقص الإیمان باللزوم)هەرئایەتێك کە باسی زیادەی ئیمان دەکا بەرێگەی تەلازوم ئەوە ئەگەیەنێ کە کەم دەکا (وذلك لأن الزیادة تستلزم النقص)ئێستا ئەم گلاسە

نیوەی ئاوی تێ بکە زیادی بکە پێش ئەم زیادە کەم بووە بۆیە زیاد ئەبێ (ولأن ما جاز علیه الزیادة جاز علیه النقص،ولأن الزیادة لاتكون إلا عن نقص)چۆن زیاد بوو ، بۆنمونە کەسێك مەعاشەکەی ٤٠٠ هەزار دینارە ئەلێ کاکە ئەم مانگە بۆی بکەرە بە ٦٠٠ هەزار و بۆی زیاد کرا ئەمە یانی پێشتر کەم بوو .

(ولهذا فإنا نجد أهل العلم كثیرا ما یستشهدون بأدلة زیادة الإیمان على نقصان )وەکو ئیمام ئەحمەد فەرموودەکەی (أكمل المؤمنین)ی کرد بە دەلیل بۆ زیاد و نوقصانی ئیمان .

(وكذا العكس اللأسباب المتقدمة ، وتأمل ، مثالا على ذلك – صنيع البخاري في صحيحه فقد أرود بعض الایات المصرحة بزیادة الایمان في باب :زیادة الإیمان ونقصانه)لەبابەکەیدا زیادە و کەمبوونەوە ئەنوسی کەچی ئایەتی زیادە ئەهێنی ! (مستدلا بها على الزیادة والنقصان معا)

(قال ابن حجر فی شرح لهذا الباب . ثم شرع المصنف یستدل لذلك بایات من القران مصرحة بالزیادة ، وبثبوتها یثبت المقابل .)بەثبوئەم ئایەتانە ثبوتی نوقصانەکە دەکا (فإن كل قابل الزیادة قابل للنقصان ضرورة)[18].

(أما النقول عن أهل العلم في هذا فكثيرة: قال الإمام أحمد :إن كان قبل زیادتة- أی الإیمان –تاما فكما یزید كذاینقص)[19]

---

[18] :فتج الباري :٤٧\١

[19] رواه الخلال في السينة : ٦٨٨\٢،ح١٠٣٠

ئینجا شێخ محمد کوری عبد الوهاب دەفەرمووی (فإن اختل شيء من هذا لم يكن الرجل مسلما)ئەگەر یەکێك لەمانە تێك بچێ واتا ئەگەر ئیمان ئەم سێ شتەی کۆنەکردەوە لە ئینسانەکەدا ئەم سێ شتە کۆنەبوویەوە لەئیمانی ئەم کەسەدا ئەو کەسە موسلمان نیە واتا بەبێ ئیمانی دل و زمان و عەمەل ئەبێ هەرسێکی کۆبکەیتەوە ئەگینا تۆ موسلمان نیت ، شێخ إجماعی نەقل کرد .

کەچی ئەمرۆ دێن ئەلێن إجماع یاخود شوبهی إجماع هەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئەگەر عەمەلیشی نەبێ موسلمانە ! بەداخەوە ئەمە ئەوکەسانە ئەم قسەیەدەکەن کەوا هیچ إعتبارێك بۆ إتفاقی صەحابە دانانێن لەبابەتی تاریکی نوێژدا .

(فإن عرف التوحيد ولم يعمل به فهو كافر)کەواتە ئەگەر کەسەکە تەوحیدی زانی یەکخوا پەرستی زانی لەدلیدا بەلام کاری پێ نەکرد جا کارەکە چ کارەکانی دل بێ یاخود کاری جەواریح بێ ئیشی پێ نەکرد (فهو كافر معاند كفرعون وإبليس وأمثالهما) ئەوکەسە کافرە وە مادەم ئەزانێ ئەوکەیە معانیدە عینادی کردوە چونکە ئەیزانی و ئیشی پێ ناکا وەکو فیرعون و ئیبلیس و نمونەکانی ئەوانە کافرە ئەمانە هەموویان ئەزانن بەلام کاریان بەتەوحیدەکە نەکردوە (وهذا يغلط فيه كثير من الناس ، يقولون هذا حق ، ونحن نفهم هذا) لەم بابەتە زۆربەی خەلکی ئەکەوێتە هەلەوە ئەلێن : (ونشهد أنه الحق ولكن لا نقدر أن نفعله) ئێمە ئەزانین ئەمە تەوحیدە حەقە بەلام ناتوانین ئەنجامی بدەین .

(ولا يجوز عند أهل بلدنا إلا من وافقهم ، وغير ذلك من الأعذار ، ولم يدر المسكين أن غالب أئمة الكفر يعرفون الحق) شێخ باسی سەردەمی خۆی دەکا ئەلێت : لەلای زۆربەی ئەهلی ولاتی ئێمە کار بەمە ناکەن ،ئێوە سەیری ئەوکاتە بکەن ئەو کاتە زەمانی عوسمانیەکان بووە زەمانی بلاوبوونەوە شیرك و قەبرپەرستی و شەخص پەرستی و هاوار کردن بۆ پێغەمبەر (صل الله عليه وسلم) و پیاوچاکان بووە واتا کاتێك کە شێخ رووی کردۆتە کەسێك کە تۆ بۆچی کار بە تەوحید ناکەی تەنها موحید و یەکخوا پەرست بی وە عیبادات هەموی بۆ خوای

تعالى تەرخان بكەی إعزاريان هێناوەتەوە (ولا يجوز عند أهل بلدنا إلا من وافقهم ، وغير ذلك من الأعذار ، ولم يدر المسكين أن غالب أئمة الكفر يعرفون الحق) زۆربەی إعزارەكانی ئومەتەكانی پێشوو حەقيان زانيوە بەلام إعزارەكەيان ئەوە بووە كە (ولم يتركوه إلا لشيء من الأعذار) تەركيان نەكردوە تەنها هەندێك عوزريان هێناوەتەوە

عوزرەكانيان بريتيەبوو :

(كما قال تعالى: ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا )[٢٠] ثمنی قەليل دونيايە هەرچەنێك زۆربێت هەر قەليلە هەرچەنێك تۆ دونيات هەبی هەر قەليلە تۆ ئايەتەكانی خوای تعالى بە بەدونيايەكی كەم دەگۆريتەوە يەكێك لە إعزارەكان ئەم كەسە تەماعی دونيايی هەيە تەماعی سەرۆكايەتی هەيە تەماعی كورسی هەيە دەلێتن ئەگەر من وابلێم ئەم رووخێنن ئەگەر وابلێم منصەبەكەم لەدەست ئەچێ و دەرم ئەكەن ياخود دەلێت ئەگەر وابلێم جاهم نامێنی ياخود بەقسەم ناكەن و پشتم تێ ئەكەن كۆمەلێكی زۆری بيانوو ئەهێنەوە بۆخۆيان ياخود لەئێستادا ئەلێ موچەكەم دەبرن و لەمزگەوتەكە دەرم ئەكەن ، ئەگەر بەسەركردەی دەولەتەكان بلێ وەرە تەوحيد جێ بەجێ بكە ئەلێ كاكە ئەوە تۆ باسی چی ئەكەيت ئەلێ خۆ ئەمريكا يەك صاروغم پێوەنێت پارچە پارچەم ئەكا يا ئەم دەسەلاتم لەدەست دەرنەچێ واتا بابەتەكە ئەگەرێتەوە بۆ دونيا ! يان دەلێن گەمارۆی ئيقتصاديمان تووش دەبێ كەوا دەلێن قەت پێغەمبەری خوا (صل الله عليه وسلم) گەمارۆيی ئيقتصادی نەدرابێ ! كە پێغەمبەران لێيان نەدرابێ! لەوانەی ئەوانەی ئەمرۆ باسی دەكەن لەم إعزارانە هەمووی بەسەر پێغەمبەران و پياوچاكاندا هاتووە .

پێغەمبەری خوا (صل الله عليه وسلم) دەفەرمووی : ("حب الدنيا وكراهية الموت")[٢١] ئەم دوانەيە .

---

[٢٠] :سورة التوبة اية :٩

[٢١] : الكتب » مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح» كتاب الآداب» باب تغير الناس

